# تیتل و بیبل و هەدایە



هۆنراوە: م. مەزهەر

نیگارکێش : محەمەد ڕۆستەمزادە




بەناوی خودای دلۆڤان

# تیتل و بیبل و هەدایە

چیرۆکی کۆنی کوردی

بەتۆزێ گۆڕانەوە


هۆنراوە:

م. مەزهەر

نگار:

محەممەد ڕۆستەمزادە

(نامۆ)



سەرناسە : مەزهەر، موفیدە ۱۳۳۲

عینوان‌ونێوی‌بەدیهێنەر:تیتل و بیبل و هەدایە/نووسەر موفیدە مەزهەر

نیگارەکان : محەممەد ڕۆستەمزادە (نامۆ)

نیشانەگەلی ڕوالەتی : ۲٦ لاپەڕەی نیگاردار

نیوەڕۆک : چیرۆکی کۆنی کوردی بۆ مندالان

شابەک : ۷-۲۷-٦۷۲۰-۹٦٤

گرووپی تەمەن : ب، ج

ڕەدەبەندی دیویی : فا/۲۱۹/۸

ژمارەی کتێبناسی میللی : م۹٤۱-۸۰

ووسەر : موفیدە مەزهەر

یگارەکان : محەممەد ڕۆستەمزادە

اشر : نووسەر

ۆبەی چاپ : چاپی هەوەڵ

ەژمار : ۱۰۰۰ دانە ـ خشتی

یزاین : ئومید موقەددەس

رخ : ۳۰۰۰ تمەن

سابەک : ۷-۲۷-٦۷۲۰-۹٦٤





ناوەندی بڵاوکردنەوە:

سەقز ـ فەرهەنگسەرای هونەر و ئەندیشە

۰۹۱۸۷۷۷۱۵۸۵




دەشتێک بوو پان و بەرین      رازاوە و پاک و نەخشین
پەپوولەی جوانی رەنگین      گوڵی سوورو زەرد وشین



دەنگی مەل و خوڕەی ئاو        تیشکی رەنگاڵەی هەتاو
لەم دەشت و مێرغوزارە        ماڵێ بچووک دیارە
ماڵی بزنێکی وریا        هۆشیار و ژیر و ئازا
دایکێ کارزان و خۆشخوو        سێ کاژەلەی جوانی بوو

خرت و مرت و ژیکەڵە      شۆخ و شەنگ و زیتەڵە
یەکیان ناوی تیتل بوو      ئەوی تریان بیبل بوو



چکۆلەکەی هەدایە      جەرگ و هەناوی دایە
گ رۆژێ بزنە دایە      گیادێنێ لەو مەزرایە
کە رۆژ بوو بە ئێوارە      کەی ئیتر کاتی کارە




دایە دیتۆ بەرەو ماڵ　　گوانی پڕشیروخۆشحاڵ
مناڵەکان ئەدوێنێ　　ئەم ئاوازە ئەخوێنێ:
«تیتڵ و بیبل و هەدایە　　درگا کەنۆ بۆ دایە
دایە شیر لە گوانیایە　　گیا لە بێخی دیانیایە»

کاژەلەکان گوێ ئەگرن     جا درگاکە هەڵئەگرن
«دایە کۆڵەکەی ماڵم     ڕووناکی ماڵ و حاڵم
بەخێربیتۆ لە خێران     لەگەڵ مانگ و ئەستێران»





ڕۆژان ڕۆیین بە خۆشی     بێ خەم و بێ پەرۆشی
بەڵام ڕۆژی لە ڕۆژان     دایک هاتەوە بە گریان





روویکرده به‌چکه‌کانی
وتی : «رۆڵه وریا بن
چون گورگێ به‌دی به‌دکار
خه‌ریکی فڕو فێڵه

کاژیله جوانه‌کانی
هۆشیاربن و ئازا بن
هاتوو چوویه‌تی وه‌ک هار
به دوای ئێمه‌دا وێڵه





بێ بەزەو بێ ئامانە     خاوەنی چنگ و دیانە
ئامان رۆڵەکەی دایە     گورگ دەرد و بەڵایە
درگاکەی بۆ هەڵنەگرن     پەڵپ و بیانووی پێبگرن»
ماوەیەک باش بەسەرچوو     هیچ دەنگ و باسێ نەبوو
گورگ خەریکی کڕوکاش     هەلێکی دەسکەوتە باش



مـــاڵی بزنـــی کـــردە چـــاو    لیحـــەرام بـــوو نـــان و ئـــاو
لیـــان کەوتـــە فێـــڵ کـــردن    هـــات و درگـــای پێگـــرتن
ڕۆژێ هات بە لوورە لوور    دەسی کرد بە قووڕەقووڕ:
"تیتـــل و بیبـــل و هەدایـــە    درگاکـــــەنۆ بـــــۆ دایـــــە





دایە شیر لە گوانیایە     گیا لە بێخی دیانیایە»

کاژیلەکان زۆرترسان     لە ترسانا ئەلەرزان

رێگای دەرچوونیان نەبوو     چیبکەن چارەیان چی بوو؟

وتیان : «رێگای لێ بگرین     پەڵپ و بیانووی پێبگرین»

کاژەل وتیان : «تۆ گورگیت     لەرەنگی دایکمان نیت!

رەنگی دایکمان شینە     یەکجار جوان و نەخشینە»





گورگە رۆیی دەسوبرد
زرمە زرم و تەپەتەپ
دیسان وتیان: «بڕۆ دەی
دایکی ئێمە بەفرینە
گورگە رۆیی بەئاسان
سپی وسۆڵ وپاک و جوان
"تیتل و بیبل و هەدایە

سەروسەرتاپای شین کرد
درگای دا بەرمشت وشەپ
کەی ئەتۆ دایکی ئێمەی
سپی و جوان و شیرینە»
خۆی گرتە ئاردی ماڵان
دای لە درگا، تەق تەقان:
درگاکەنۆ بۆ دایە



دایە شیر لە گوانیایە — گیا لە بێخی دیانیایە»
بەڵام دیسان کاژەڵە — وتیان بە گورجی و پەلە:
«خۆ دایکی ئێمە سوورە — بێگەردە وەک بلوورە
تۆ تۆزاوی و چڵکنیت — بڕۆ دایکی ئێمە نیت»
گورگە خۆینا قوڕی سوور — هاتەوە بە لوورە لوور
کاژەڵەکان هەم دیسان — گورگەیان هەڵفریوان





گورگە بەم فێڵەی زانی  نەوەستا بۆ بەیانی
تێگەیی کاژیلەکان  هەم هۆشیارن هەم ئازان
درگای دا بەرهێزی شان  لە گرێژەنەی ترازان
پڕی دایە کاژەلە  دووانی قووت دا بە پەلە
خۆی شاردەوە هەدایە  چاوەروانە بۆ دایە
دایک هاتەوە بەرەو ماڵ  روانی لە حاڵ و ئەحواڵ
دی درگاکەی شکاوە  ماڵەکەی شپرزاوە





هاواری کرد : «تیتل گیان
خاکی کوێ کەم بەسەرما
هەدایە زۆر ترسا بوو
وتی: «دایە دایە گیان!
کەوتە خۆ بزنی ئازا
ماڵی ورچی کردە چاو

هۆی هەدایە، بیبل گیان
روولە کێ کەم بەم سەرما»
هەر رۆحی پێنەما بوو
تیتل و بیبل یان ڕفان»
بەهەر چوار دەورا گەڕا
بازیدا سەر بان بە تاو



کردیە هەرا و تەپەتەپ
ورچە بۆر بە بۆڵە بۆڵ
وتی: «کێیە لەو بانە
بەو زرمە و تەپ وتۆزە
بزن قیڕاندی ئەمجار:
منم چاو بزبزۆکی
کێ خواردی بەچکەکانم

ڕاکەڕاکە و شەپەشەپ
دەرپەڕی لە ماڵی چۆڵ
خەریکی رەپ رەپانە
پڕبوو کیتەڵە و گۆزە!»
«ورچە بۆرەی ستەمکار
شاخم وەک بێڵ بێڵۆکێ
بێتە شەڕە مەیدانم»



ورچە زۆری پێ داچوو
وتی: «ئاگام لێ نییە!
شەڕی چی مەیدانی چی؟
بزن، بازیدا سەربان
کردیە هەرا و تەپەتەپ
گورگە لەماڵا کەوتە!
ئەڵێ : «کێیە لەو بانە
بەو زرمەو تەپ و تۆزە

چوونکە گوناهی نەبوو
ئەو هەرا چییە؟
کاژیلەیچی، خوانی چی؟»
گورگی چاوبرسی مل پان
ڕاکە ڕاکە و شەپە شەپ
سکی تێرە لیخەوتە!
خەریکی ڕەپ ڕەپانە
پڕبوو کیتەڵەو گۆزە»

بزن کـــــردی بـــــەهاوار :

مـــــنم چـــــاو بزبزۆکـــــێ

«گـــــورگی دڕی ســـــتەمکار

شـــــاخم وەک بێـــــڵ بێڵـــــوکێ



کـــــێ خـــــواردی بەچکـــــەکانم

گـــــورگ وتـــــی:«مـــــن خواردومـــــە

جـــــەنگت ئـــــەوێ، بـــــە چـــــاوان!

بێتـــــە شـــــەڕە مەیـــــدانم»

رزقـــــی خـــــۆم بـــــوو، بردوومـــــە!

دێمـــــە شـــــەڕت لـــــە مەیـــــدان»



بزن زانی بەم جۆرە    گورگ مەیلی شەڕوشۆڕە
رانەوەستا گورج هەڵات    شکات بۆ قازی ببات
باسەکەی بۆ گێڕاوە    قازی زۆردڵی داوە



فەرمووی سەیزوو بەیانی     بچنە شەڕە مەیدانی
گورگی ملهوڕ ئەمجارە     کەوتە تەکبیر و چارە
هەمانەیەکی هێنا     پڕیکرد لە بۆن و با
بۆ وەستای ئازا وکاری     هەمانەی برد بەدیاری!

وتی : «کاکی ئاسنگەر
فەرموویانە بەیانی
جەنگم لە گەڵ بزنانە
وەستای زانای پڕ هونەر
بچمە شەڕە مەیدانی
شاخ تیژە، زوان نەزانە



تیژی کە دیانەکانم
وەستا وتی: «بەسەر چاو
ئەو هەمانە لەولاوە
دەردی پەنجەت لە گیانم»
مامە گورگەی ناو زڕاو
بۆ حەق دستت هیناوە؟»

ـی : «بەڵێ هی منە         ناقابیلە، تووتنە!»
ـوت و خاڵی هەمانە         هەڵگرتنی ئاسانە!
وەستا بەم فێڵەی زانی         لە ژێرلچۆ بۆڵانی:



«هۆی حیلەبازی بەدفەڕ         دوژمنی کاژیلەو مەڕ
ئەبێ بیکەمە کارێ         ئابڕوت بچێ بە جارێ!»
وەستا مام گورگی دانا         چەکوش وگازی بۆ هێنا



دوو کەڵپەی گورگی کێشا     گورگ بوراوە لە ئێشا!
ماموەستای زانای زۆرزان     لبادی نا جێگەی دیان!
گورگ هەرچەن فێڵەزانە     لە زانستا نەزانە!
نەی زانی چی قەوماوە     چی بەسەرا هێناوە
ڕۆییشتەوە بەرە و ماڵ     بێئاگا بوو لە ئەحواڵ

لەم لاشەوە بزن چوو
ماسێکی جوان و شیرین
ژەنگی دڵ ئەباتەوە

تیکلە ماسی هێنا زوو
وەک مەرهەم بۆ سەربرین
نەخۆش چاک ئەکاتەوە!



تا بەر دوکانی وەستا
وتی:«وەستای ئازا و ژیر
قازی فەرمووی بەیانی
وەستا ئامان سەد ئامان
تیژی کە شاخەکانم

هەرهەڵات و نەوەستا
بۆم بکە ڕا و تەکبیر
بچمە شەڕە مەییانی
لە گەڵ گورگە جەنگمان
دەردی پەنجەت لە گیانم



با ورگی گورگ بدڕێنم
تیتل و بیبل دەربێنم»
وتی: «هۆ بزنی دایە
چارەت لە دەس مندایە
گورگە دڕە و زۆردارە
درۆزنە و بەدکارە
ئەمن یارمەتیت ئەدەم
شاخەکانت چاک ئەکەم!»
پۆلای خستە سەر شاخی
با گورگە بێ بە داخی
بۆ بەیانی سبحی زوو
هێشتا خۆر نەکەوتبوو
مەییانەکەی بەرمالان
بوو بە شوێنی شەق شەقان





خەڵکی هەمووی وەستاون     بۆ سەیریان بانگ کراون
گورگە هەڵمەتی هانی     قەپی لێگرت بە دیانی
لبەد کەی بۆ دیان ئەبێ!     هەر گورگە ئابڕوی ئەچێ
قەپی گرت، بە هیچ نەبوو     بزنۆکەی لەدەم بەربوو!
نۆرەی گورگ تەواو بوو     بزنە کەوتە هاتوو چوو

سمکۆڵی کرد، تی تەقاند    شاخی لە ورگی چەقاند!
سکی گورگەی هەڵدڕی    تیتل و بیبل دەرپەڕی!
تیتل و بیبل و هەدایە    دەسیان کردە مل دایە





منالە جوانەکانم    رۆڵە شیرینەکانم
ئەم چیرۆکە دوایی هات    یاخوا بگەن بە ئاوات
هۆشیار بن و زانا بن    بە فێڵی گورگان نەچن

تەواو

